

# ئیعجازی زانستی فیسیۆلۆژیای نووستن و بەرنامەی نموونەیی نووستن

# Scientific Miracles of Sleep Physiology and Optimal program for Sleeping

## الاعجاز العلمي لفسيولوجيا النوم والبرنامج الأمثل للنوم


**By**

**Dr. Shwan Hussein Sofy**

**(PhD in Molecular Physiology)**

Lecturer of Biology / Physiology

Researcher in Physiology and Scientific Miracles in Quran and Sunnah



ايلول 2017 ميلادي　　　　ذي الحجة 1438هجري

# پوختە Abstract

نووستنSleep دیاردە وبارێکی زیندەگی و زیندەفرمانی یە Biological and physiological state و جهانێگی نامۆ وسەرسوڕهێنەرە, پڕە لە نهێنی و پەند و وانەی درەوشاوە و ئایەتێکە لە ئایەتە ڕوون و ئاشکراکانی خودای پەروەردگار, نووستن نیعمەت و بەخششێکی ناوازەی خودای پەروەردگارە وگەواهیدرە لەسەر گەورەیی و توانا و دانایی و ووردکاری و زانایی خودا لە بەدیهێناندا, ئەستەمە مرۆڤ بەبێ نووستن لەش ساغ و تەندروست و کارا بمینێتەوە وبەردەوام بێت لە ژیاندا, لە ڕاستیە زانستیەکان Scientific facts و توێژینەوە تاقیکاریەکان Experimental Research بەردەوام نهێنی تازە و ئیعجازی زانستی دەربارەی دیاردەی نووستن ئاشکرا دەکەن. ئاما نجی ئەم توێژینەوەی خستنەڕوویەدا Review Research دەرخستنی هەندێك لە نهێنی و ڕاستیە زانستییەکانی نووستن و ئیعجازی زیندەفرمانزانی نووستن و بەرنامەی نموونەیی نووستنە لە قورئان و فەرموودەدا.

پێناسەکردن و وەصفکردنی نووستن بە متبوون (سبات) و مات و خامۆشی و پشوودان لە قورئاندا﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ,النبأ 11﴾ وە دەفەرموویێت: (وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاسًا وَالنَّوْمَ سُبَاتًا, الفرقان آية 47) تەواو یەکانگیر و کۆکە لەگەل زیندەفرمانزانی Physiology و سایکۆلۆجی Psychology نووستن, نووستن بە بارێکی پشوودانی تەواوی خانەکانی لەشە و بە متبوونی وخامۆشی چەندین زیندەفرمانی دەماری جیادەکرێتەوە لەوانە کەمبوونەوەی و بچرانی پەیوەندی و گەیاندنی نێوان سەدان ملیۆن لە دەمارە خانەکان Neurons و کەمبوونەوەی شە پۆلەکارەبایەکانی مێشك Electro-encephalogram (EEG) و وەستانی کاری ماسولکە خۆیستەکان Voluntary Muscles و بێ هەستبوون و بێ ئاگابوون و پچڕان لەگەڵ دەوروبەردا و هێواشبوونی لێدانی دڵ و دابەزینی پەستانی خوێن و پلەی گەرمی لەش و زیادبوونی ئاستی پێوەری هەستپێکردنی وریاکەرەوەکان Sensory threshold , نووستن بارێکی پشوودان و ئارامی دەماری و ژیریی و دەروونی و لەش و خۆتازەکردنەوە و بەرنامەرێژکردنەوەی تێکرای زیندەفرمانەکانی لەش و رزگاربوونیان لە چەندین پاشەڕۆ و بەرهەمە لاوەکیەکانی زیندەفرمانەکان Metabolism Byproducts و ژەهرەکانیان Toxins لە خانەکاندا.

دەرەنجام و داتاکانی توێژینەوە تاقیکارییەکانی زیندەفرمانەکان و تەندروستی نووستن چەندین ڕاستی زانستی و ئیعجازی زانستی ڕوون وئاشکرایان لە بەرنامە و شێواز و ڕێنمایی و ئاکارەکانی نووستنی پێغەمبەری خودایان صلى الله عليه وسلم دەرخستووە, هەر لە زوو نوستنی شەوانە و ماوەی پێویستی نووستنی شەوانە و نووستن لەسەر لاتەنیشتی ڕاست و سەرخەوی نیوەڕۆ وخوێندنی و یردەکانی نووستن بە بەرنامەی نموونەیی نووستن Optimal program for sleeping دادەنرێت و تەواو یەکانگیر و هاویەکە لەگەل کاتژمێری زیندەگی لەشی مرۆڤ Biological Circadian rhythm. ئەوەی لە سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خودا صلى الله عليەوسلم هاتووە هەق و ڕاستە لە لایەن خودای پەروەردگاری جیهانیان هاتووە ﴿لَّٰكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ ۖ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ ۖ وَالْمَلَائِكَةُ يَشْهَدُونَ ۚ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا, النساء: 166﴾.

دەرەنجام وداتای توێژینەوە تاقیکاری و ڕوپێویەکان Experimental and Survey Research دەریانخستووە زوو نووستنی شەوانەEarly sleeping at night و ماوەی پێویستی نووستنی شەوانە تەواو یەکانگیر و هاویەکە لەگەل کاتژمێری زیندەگی لەشی مرۆڤ Biological Circadian rhythm و سوود و ڕۆڵ وکاریگەری زۆر باش وئەرێنی هەیە لەسەر هۆش و ژیریی و باری دەروونی مرۆڤ و زیندەفرمانەکان و تەندروستی لەشی مرۆڤ, هەر لە کەمکردنەوەی دڵەڕاوکی Anxiety و گرژی دەماری Tension and irritability و سترێسی دەروونی Psychological stress و باشکردنی میزاج و مۆڕالی کەسی Mood and Moral و دووربوون لە خەوزڕان Sleep deprivation و تێکچوون و شڵەژانەکانی نووستنی شەوانە و باشکردنی زیندەفرمانی هزری و ژیری مێشك Cognitive performance و یادگا وزیادبوونی بەئاگایی Alertness و زیادبوونی چالاکی لەش و کارامایی کار و بەرهەمهێنان Productivity وداهێنان Creativity لە ڕۆژدا, هەروەها دەرکەوتوو زوو نووستنی شەوانە

**کاریگەری زۆر باشی هەیە لە ڕاگرتنی کێش لەش و کەمکردنەوەی ئەگەری تووشبوون بە قەڵەوی** Obesity **ومەترسیەکانی نەخۆشی شەکرە**Diabetes type 2 **و بەرزە پەستانی خوێن و نەخۆشیەکانی دڵ و مێشك و دەماریی و کێشە وگرفتی هەرس و ریخۆڵەکان و گورچیلەکان وباشکردنی سیستەمی بەرگری لەش و دووربوون لە شەکەتبوون و ئێش وئازاری ماسوڵکەکان و تازەکردنەوە و ڕەوەنقکردنی خانەکانی پێست و دواخەستنی ماکەکانی پیربوون** Aging **و نەخۆشیەکانی پەیوەست بە پیری** Aging- related Diseases.

**لە چەندین توێژینەوەی زیندەفرمانزانی دەماریی دا** Neurophysiology **دەرکەوتوو کەوا نووستن لەسەر لاتەنیشت کاریگەری زۆر کاراو باشی هەیە لەسەر تەندروستی و زیندەفرمانەکانی مێشك لە ریگەی چەندین میکانیزم لەوانە رزگاربوون لە پاشەرۆیە لاوەکیەکانی زیندەکردارەکانی مێشك** Metabolic waste products **و فراوانبوونی نێوانە بۆشایی مێشك** Brain interstitial space **بە ریژەی** 60٪ **و باشکردن و خێراکردنی گوزەری شلەی مێشك ودرکە پەتك و پاکردنەوەی مێشك لە میانەی زیندەریچکەکانی گلایمفاتیك** Glymphatic pathway **پارانکیمای مێشك پاك دەبێتەوە لەپاشەرۆیە تواوەکان وەك تاوە پرۆتین و بیتا ئەمایلۆید** Beta amyloid and tau proteins **و تۆکسینەکان** Toxins **و بەرهەمەلاوەکیەکانی زیندەکردارەکان** Metabolisms Byproducts .

**هەروەها توێژینەوە تاقیکاریەکان** Experimental research **دەریانخستووە لەسەر لاتەنیشتی ڕاست** Lateral-sleeping position **ریگەیەکی خۆپاریزی زۆر کارا وباشە لە کەمکردنەوەی مەترسیەکانی نەخۆشی درێژخایەنی نازیندەفرمانی سکۆلەی چە پی دڵ** Chronic Left Ventricular Dysfunction **و ناتەواویەکانی دڵ** Congestive heart failure **و باشترکردنی زیندەفرمانی ماسولکەکانی سکۆڵەی چە پی دڵ و کاریگەری زۆر باشی هەیە لە کەمکردنەوەی توندی و مەترسیەکانی وەستانی هەناسەدان لە کاتی نووستندا**Sleep apnea **وباشکردنی زیندەفرمانەکانی هەناسەدان لە ریڕەو و بۆریچکەکانی هەوا وسی یەکان** Trachea and lungs **و زیادکردنی قەبارەی ئاڵوگۆڕی گازەکان** Gas exchange **و زیادکردنی زیندەقەبارەی هەوای سی یەکان**Pulmonary vital capacity **و پاریزراوبوون لە زوو زوو لەخەوهەستان وتووشبووونی خەوزڕان و بێزاری و ئێش و ئازاری ملّ و شان و قاچەکان دەبن بەراورد شێوازەکانی تر نووستن وەك لەسەر سك** Prone **نووستن**.

**بە پێ چەندین توێژنەوەی زیندەفرمانی دەماری و تەندروستی ودەروونی لەسەر سەرخەوی نیوەڕۆ (قەیلولە)** Midday Napping **دەرکەوتوو چەندین سوود و کاریگەری زۆرباشی هەیە لەسەر تێکرای زیندەفرمانەکان و تەندروستی** Physiological and Health Benefits **و سەلامەتی لەشی مرۆڤ, هەر لە باشکردنی زیندەفرمانەکانی مێشك** Neurophysiology **باشکردنی درککردن** Mental **و وەبیرهاتنەوە و یادگا** Memory recall **و فێربوون** Learning **و زیرەکی** Intelligence **و باشکردنی زیندەفرمانی هزری و ژیری مێشك** Cognitive performance **زیادبوونی بەئاگایی** Attention **و زیادبوونی چالاکی لەش و کارامایی کار** Skill **و بەرهەمهێنان**Productivity **وداهێنان** Creativity **و باشکردنی میزاجی کەسی و باری سۆزی دەروونی** Emotional and Mood **و راستکردنەوەی باری روخاوی دەروونی و نەهێشتنی بێزاری و سەرقاڵی کاروباری رۆژانەی ژیان. وە هەروەها دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی فشار وسترێس** Stress **و باشکردنی بەرگری لەش** Reduce Stress And Protect Immune System **لە ریگەی گەڕاندنەوەی ئاستی سروشتی هۆرمۆنەکان و ریفرێشکردنەوە و تازکردنەوەی زیندەپێوەرەکانی دەمارەخانەکانی مێشك و بەرگری لەش** Biomarkers of neuroendocrine and immune **بۆ ئاستی سروشتی و نۆرماڵی خۆی, هەروەها سەرخەوی نیوەڕۆ رۆڵی کارای هەیە لە پاراستنی مرۆڤ لە نەخۆشیەکانی دڵەلوولەکۆئەندام** Cardiovascular diseases **وتێکچوونەکانی دەماری** Neurodegenerative disorder.

## 1ـ پێشەکی Introduction

حەمد و سوپاس وستایش بۆ خودای پەروەردگار و بەدیهێنەری زانا وکاربەجێ, درووود و صەلات وسەلامی خودا لەسەر پێغەمبەر ونێردراوی خودا موحەممەدی پێشەوا و پێشەنگ ومامۆستای مرۆڤایەتی و لەسەر خانەوادە و هاوەڵانی و شوێنکەوتووانی بە چاکە تا رۆژی دوایی.

نووستن بەخشش و نیعمەتێکی گەورەی خودای پەروەردگارە بۆ مرۆڤ و گیانەوەران, مەحالە ژیانی مرۆڤ وزۆرێك لە گیانەوەران بەردەوام بێت بە بێ نووستن و تەنانەت تێکچوون و لاسەنگ بوونی سوڕی نووستن و بەئاگاهاتن Wakeup/Sleep cycle , مرۆڤ تووشی چەندین نەخۆشی لاشەیی و دەروونی دەکات و تەندروستی تێکدەچێت و توانا ژیری و هزرییەکانی مێشك لەدەستدەدات . نووستن نیعمەت و بەخششێکی ناوازەی خودای پەروەردگارە, گەواهیدرە لەسەر گەورەیی و توانا و ووردکاری و دانایی خودا لە بەدیهێنانداا, نووستن جیهانێکی نامۆ و سەرسوڕهێنەرە پڕە لە نهێنی و پەند و وانەی درەوشاوە. خوای گەورە دەفەرموێت : وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُمْ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَاؤُكُمْ مِنْ فَضْلِهِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ, الروم 23, وە دەفەرموێت ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاسًا وَالنَّوْمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُورًا﴾ (الفرقان :47 ). واتە :لە ئایەت ونیشانە وبەڵگەکانی عەزەمەتی خودای پەروەردگارە نووستنە, کاتی پشوودان و خامۆشی ومات و بێ جووڵەی لەشە و نەهێشتنی ماندووبوون و شەکەتی و تازەبوونەوەی زیندەفرمانەکانی لەشە(1,2).

نووستن Sleep رەفتار وبارێکی زیندەگی تایبەتە, لە میانەیدا مرۆڤ دەچێتە بارێکی خاوبوونەوەی ماسولکەکانی لەش و کەمبووونەوەی درککردن و وەلامدانەوەی بۆ هاندەرە دەرەکیەکان External stimulus و کەمبونەوەی شەپۆلە کارۆموگناتیسەکانی مێشك و دوبارە تازکردنەوەی زیندەچالاکیەکانی دەماغ و ئەندامەکانی دیکەی لەشە, لە رێگەی چەندین میکانیزمی ووردی کردارەکانی رێکخستن وهاوسەنگی ناوەکی Homeostasis رێکدەخرێت(3,4) .

نووستن Sleep بارێکی زیندەگی و زیندەفرمانی Biological and physiological state و بێ هەستی و بێ ئاگایی Unconsciousness زۆر ئالۆزە, خوای پەروەردگار ژیان و پێکهاتەی زیندەگی مرۆڤ و شیردەرەکان و باڵندەکان و ووشکەئاوییەکان و خشۆکەکان و ماسیەکان و تەنانەت مێرووکان و هەندێك لە کرمەکانیشی لەسەر سروشتاندووە و زۆر ئەستەم ومەحالە مرۆڤ بەبێ نووستن لەش ساغ و تەندروست و کارا بمینێتەوە وبەردەوام بێت لە ژیاندا.

نووستن بە چەندین زیندەفرمانی دەماری جیادەکرێتەوە لەوانە کەمبوونەوەی و بچرانی پەیوەندی و گەیاندنی نێوان سەدان ملیۆن لە دەمارە خانەکان Neurons و کەمبوونەوەی شەپۆلەکارەبایەکانی مێشك Electro-encephalogram (EEG) و وەستانی ماسولکە خۆیستەکان و بێ ئاگابوون و پچڕان لەگەڵ دەوروبەردا و هێواشبوونی لێدانی دڵ و دابەزینی پلەی گەرمی لەش و زیادبوونی ئاستی پێوەری هەستپێکردنی ورياکەرەوەکان Sensory threshold , نووستن بارێکی پشوودان و ئارامی دەماری و دەروونی و لەشە وچەندین زیندەفرمانی زۆر بنەڕەتی هەیە وەك خۆتازەکردنەوە و بەرنامەرێژکردنەوەی تێکرای زیندەفرمانەکانی خانەکانCellular Recovery/Repair وپاراستنی ووزەی لەش Energy Conservation و راهاتنی ناکارایی و ناچالاکی لەش Adaptive Inactivity رزگاربوونی خانەکان لە چەندین پاشەرۆ و بەرهەمەلاوەکیەکانی زیندەکردارەکان Metabolism Byproducts و ژەهرەکانیانToxins وکەمکردنەوە سترێسی ئوکساندن Oxidative

**وتازەكردنەوەی پەیوەنـدی گەینەكـەكانی دەمارەخانـەكانی مێشـك** Neural Network Reorganization **و سـاغ و** Stress **تەندروستی هێشتنەوەی تێكرای زیندەفرمانەكانی ئەندامەكانی لەش و پاراستنیان لە تووشـبوون بـە چـەندین دەرد ونەخۆشـی**( 3-10 ).

## ئامانجی توێژینەوە: Objective of the Study

**ئامانجی ئەم توێژینەوەیە** Review Research **خستنەڕووی نهێنیـەكان و ڕاسـتیە زانسـتییەكانی نووسـتن و ئاماژەكـانی ئیعجازی زیندەفرمانزانی نووستنە لە قورئان و فەرموودەدا, وە خسـتنەڕووی بەرنامـەی نموونـەیی نووسـتن** Optimal program for sleeping **و یەكانگیری تەواو و گونجاویی لەگەڵ كاتژمێری زیندەگی لەشی مرۆڤ** Biological Circadian rhythm **لـە ئاكار و ڕێنماییەكانی پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم دەربـاری نووستن.**

## 2ـ ئیعجازی زانستی زیندەفرمانەكانی نووستن و باری متبوون

## Scientific Miracles of Physiology and Dormant of Sleeping

### زیندەفرمانی نووستن Sleeping Physiology :ـ

**نووستن بارێكی بێئاگایی زیندەفرمانی دەمارییە** Neurophysiology**,تواناى مێشك بۆ وەڵامدانەوەی كارتێكەر و وریاكەرەوە دەرەكیەكان** External stimuli **زۆر كەم دەبێتەوە و باری زیندەگۆڕان وتازەبوونەوەی و پشوودانی تێكرای زیندەكردار وزیندەفرمانەكانی لەشە, كلیلی بەگەڕخستنی نووستن و ڕێكخستن و كۆنترۆلكردنی سوڕی نووستن وهەستان** Sleep/wakeup cycle **لە مێشكدا دەكەوێتە بەشی ناوەكە بینراوی** Ventrolateral preoptic nucleus (VLPO) **پێشەوەی ژێرلانكەی مێشك** Hypothalamus **و سەروەی قەدی مێشك** Brainstem **ئەم ناوچانە لە كاتی نووستن چالاك وكارایە وتۆڕێكی زیندەفرمانی پێك دێنێت كە بە تۆڕی سیستەمی چالاككەر** Reticular activating System **ناودەبرێت** (وێنە: 1 )**,لە ڕێگەی بەكارهێنانی زیندەگەردی گویزەرەدەمارەكانی وەستێنەر وەك گابا** GABA **و گالانین** Galanin **ناوەندە بەئاگاكانی مێشك** Arousal centers **دەوستێنێت و كپدەكات,ناوچەی بەشی ناوەكە بینراوی** Ventrolateral preoptic nucleus (VLPO) **زۆر بەهێزە دەتوانێت ناوچەكانی هاندەری بەئاگابوون** Wake **بكوژێنێتەوە و بوەستێنێت** Inhibition (**وێنە:** 1) **كاتێك دەمارەخانەكانی لاتەنیشتی ژێرلانكە مێشك زیندەگەردی هایپۆكریتین** Hypocretin **یان ئۆركسین** Orexin **و هیستامین** Histamine **ووندەكەن دۆخی بێئاگابوون و بێهۆشی لە بەشی هەرەگەورەی دەماغ كە توێكڵی مێشك پەیدادەبێت و هانی دەستپێكردنی باری نووستن دەدات. بە گشتی كارلێكی فاكتەرەكانی هاوسەنگی ناوەكی** Homeostatic factors **و فاكتەرەكانی ڕێكخەری كاتژمێری زیندەگی** Circadian biological factors **كات و جۆری نووستن دیاریدەكەن, هەردوو هۆرمۆنی سیرۆتۆنین** Serotonin **و میلاتۆنین** Melatonin **ڕۆڵێكی سەرەكیان هەیە لە نووستندا** ( 4,5 ). **زیندەگۆڕانی باری بەئاگایی و وریایی** Wakefulness **بۆ باری نووستن و بێئاگایی** Sleep **زۆر خێرایە تەنها چەند چركەیەك دەخایەنێت وەك گۆرینی سویچ پلاكی كارەبایی وایە** Flip-Flop Switch ( 11-14 ).

**هاویەکی نووستن و زیندەکرادری متبوون:**

متبوون (سبات) لە زیندەگی و پزیشکیدا Biology and Medicine چوونە ناو بارێکی پشوودان و حەسانەوەی تەواو و بێ ئاگایی و بێهۆشی دەماریی و نەمانی جووڵەی لەش و کەمبوونەوەی تێکڕای زیندەچالاکیەکانی مێشك و خۆتازەکردنەوەی خانەکانی لەش و ڕزگاربوونیان لە پاشەڕۆیە لاوەکیەکان و ژەهرەکانی زیندەچاڵاکیەکان, ڕاستیە زانستەکانی زیندەفرمانزانی نووستن Sleep Physiology دەریدەخەن و دوپاتی دەکەنەوە کەوا نووستن بە مانا و مەبەستی تەواو بارێکی متبوون و خامۆشی لەشە( سبات )ە.

لە کاتی نووستندا زیندەگۆڕانە لـە دەردانــی چـەندین هۆرمـۆنی زیندەفرمانــەکان و هاوسـەنگی نــاوەکی ڕوودەدات و ریفـۆرم و چاکبونەوە Repairs و تازبوونەوە Regeneration و پاکبونەوەی Cleaning خانــەکانی مێشــك و خانــەکانی تێکــڕای لــەش دەست پێدەکات و مرۆڤ دەکەوتە ناو بارێکی تەواو بێئاگایی و بێ هۆشی و کپ و مات وخامۆشیدا و لە جوولەدەکەوێت (15-20).

نووستنی بارێکی پشوودان و حەسانەوەی تەواوی خانە وشانە و ئەندام و زیندەئامێرەکانی لەشە و بەبێ نووستن مرۆڤ تووشی شەکەتی و نازیندەفرمانی خانە وشانە ئەندامەکان و چەندین دەرد ونەخۆشی دەبن, وە ئەستەم ومەحالە مرۆڤ لەش ساغ و تەندروست وکارا و خاوەن ژیریی تەواو بێ وبەردەوام بێ لە ژایاندا وەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: (**وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا,النبأ** 11 ) خوای پەروەردگار نووستنی گێراوە بە کاتی متبوون و خامۆشی و پشوودانی لاشە و دەروونە و وەستانی جوولە و چالاکی,وە دەفەرمووێت: (**وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاسًا وَالنَّوْمَ سُبَاتًا, الفرقان آية** 47). ئەو خودایەی تاریکی شەوی گێراوە بە پۆشاك و پۆشەری ئۆقرەیی و ئارامی ژیانی مرۆڤ و زیندەوەران,ە و نووستنی گێراوە بە مات وخامۆشی وکپ و بێ کاروجوولە و پشوودانی لەش و دەروون, نووستن بەڵگە و نیشانەیکی زۆر سەرسورهێنەر و بڕاوەیە لەسەر دەسەلات و گەورەیی و توانایی و زانایی و دانایی خودای بەدیهێنەر و پەروەدگار. پاك و پیگەری بۆ خودا وەصف و پێناسەکردنی نووستن بە متبوون (سبات) تەواو یەکانگیر و کۆکە لەگەل زیندەفرمانزانی و سایکۆلۆجی نووستن,بەڵگەی ڕوون وئاشکران لەسەر ئەوەی قورئانی پیرۆز ووتە و کەلامی خودای پەوەردگاری بەدیهێنەر و پەنهانزانی پێکهاتەی زیندەگی و دەروونی مرۆڤ و زیندەوەرانە.




وێنە (1): ناوچەکانی زیندەفرمانەکانی نووستن لە مێشك Sleeping zones in brain

## 3ـ ئیعجازی زانستی نووستن لەسەرلاتەنیشتی ڕاست

## Scientific Miracle of sleeping on Right lateral

دەرەنجام و داتاکانی توێژینەوە تاقیکارییەکانی زیندەفرمانەکان و تەندروستی نووستن , چەندین ڕاستی زانستی و ئیعجازی زانستی ڕوون وئاشکرایان دەربارەی باشترین و تەندروستترین بەرنامەی نموونەیی نووستن Optimal program for sleeping و شێوازەکانی نووستن دەرخستووە وەك نووستن لەسەر لاتەنیشتی ڕاست و دەست خستنە ژێر ڕوومەت كە لە ئاكار و ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوداوە صلى الله عليه وسلم هاتووە.

لە چەندین فەرموودەدا پێغەمبەری خودا باسی ئاداب و ئاکاری نووستن دەکات و فەرمان بە مسوڵمانان دەکات لەسەر لا تەنیشتی ڕاست بخەون و ناوی خوا بێن و زیکر و ویردەکان بخوێنن, لەوانە : عن البراء بن عازب -رضي الله عنهما-: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إذا أتيت مضجعك فتوضأ وضوءك للصلاة ثم أضطجع على شقك الأيمن ) (رواه مسلم).واتە: بەڕائی كوڕی عازب خوا لێان ڕازیبێت دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی (هەرکاتێك ویستت بچیە سەر جێگا و پێخەفەکەت دەستنوێژت بگرە بۆ نوێژ و لەسەر لا تەنیشتی ڕاست پاڵکەوە وبخەوە), لە چەندین فەرموودەشدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی کردووە مسوڵمانان لەسەر سکدا بخەون وەك لە فەرموودەی (عن أبي هريرة رضي الله عنه: أن النبي صلى الله عليه وسلم رأى رجلا مضطجعا على بطنه فقال ان هذه ضجعة لا يحبها الله, رواه ابن أبي شيبة و الترمذي و أحمد. واتە: ئەبو هوریرە خوا لێ ڕازیبێت دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پیاوێکی بینیی لەسەر سکدا نووستبوو فەرمووی ئەمە پاڵکەوتنێکە خودا خۆشی ناوێت, وە لە ڕیوایەتی تر هاتووە کەوا پێغەمبەری خودا هەرکەسێك لەسەر سکدا خەوتبوایە بانگی دەکرد و نەهی لێ دەکرد بەم شێوەیە بخەوێت و دەیفەرموو ئەوە نووستنی ئەهلی دۆزەخە.

## 3.1. كاریگەرییە باشەكانی نووستنی لەسەر لاتەنیشت لەسەر دەماغ
## Beneficial effects of lateral sleeping position on brain

شێوازی نووستن و جێگە و شێوەی دانانی سەر و پشت و باسك و قاچەكان لە كاتی نووستندا كاریگەری زۆری هەیە لەسەر بار و سیستەمی تەندروستی مرۆڤ, بە پێ چەندین توێژینەوەی ئەم دەیەی كۆتایی باشترین شێوازی نووستن sleep position نووستن لەسەر لا تەنیشتە یارمەتیدەرێكی زۆرباشی درکە پەتك و گەردنەو دەبێتە هۆی خەوێكی پڕ سوودی تەندروستی شەوانە وپارێزەرە بۆ زیانەكانی ئەم ماوە درێژەی مرۆڤ تێدا دەمێنێتەوە. لە توێژنەوەكان دەركەوتوو ئەو كەسانە لەسەر تەنیشت دەخەون Lateral-sleeping position زۆر بەكەمی لە شەودا زوو لەخەودا هەڵدەستن و تووشی بێزاری و ئێش و ئازاری مل و شان و قاچەكان بەراورد لەگەڵ ئەو كەسانەی لەسەر سك Prone یان بە شێوازی تر دەخەون (21-22) (وێنە:3).



وێنە(3):شێوازی نووستنی لەسەر لاتەنیشت **Sleeping on Right lateral**

لە چەندین توێژینەوەی زیندەفرمانزانی دەماریی دا Neurophysiology دەركەوتوو كەوا نووستن لەسەر لاتەنیشت كاریگەری زۆر باشی هەیە لەسەر تەندروستی و زیندەفرمانەكانی مێشك لە رێگەی چەندین میكانیزم لەوانە رزگاربوون لە پاشەرۆیە لاوەكیەكانی زیندەكردارەكانی مێشك Metabolic waste products لە میانەی زیندەرێچكەكانی گلایمفاتیك Glymphatic pathway كە بریتیە لە كرداری ئالوگۆری نێوان شلەی نێوانە خانەكان Interstitial fluid (ISF) و شلەی مێشك ودركە پەتك Cerebrospinal fluid (CSF) لە رێگەی سیستەمێكی ناوازی تونێل و كونیلەكانی دەوری لوولەكانی خوێن Perivascular tunnels كە ئەستێرە دەمارەخانەكان Astrocytes دروستیانكردووە, بەهۆیەوە پارانكیمای مێشك پاك دەكەنەوە لە پاشەرۆیە تواوەكان وەك تاوە پرۆتین و بیتا ئەمایلۆید Beta amyloid and tau proteins و تۆكسینەكان Toxins و بەرهەمە لاوەكیەكانی زیندەكردارەكان Byproducts of metabolisms (وێنە:4). لە خەوی قووڵدا قەبارەی نێوانە بۆشایی مێشك Brain interstitial space فراوان دەبێت وبەرگری جوولە وگوزەری مادەكان بۆنمچە لوولەكان ی دەوری لوولەكانی خوێن كەمدەبێت و ئالوگۆری نێوان شلەی مێشك ودركە پەتك Cerebrospinal fluid (CSF) و شلەی نێوانە خانەكان Interstitial fluid (ISF) خێرا وئاسان دەبێت, بە وورژومە گواستنەوە Convective flow پاشەرۆیە تواوەكان وەك تاوە پرۆتین و بیتا ئەمایلۆید Beta amyloid and tau proteins و تۆكسینەكان و بەرهەمە لاوەكیەكانی زیندەكردارەكان بەئاراستەی بۆشایی نمچە لوولەكانی Para-vascular space دەوری خوێنهێنەرەكان دەگوازرێنەوە, دواتر لە رێگەی لیمفە لوولەكانی ملدا بە یەكجاری پاكدەكرێتەوە (30-24).

**لە توێژینەوە تاقیکاریەکان دەرکەوتوو کەوا کاتێك مشك و جرجەکانی تاقیگا دەخوێندرێت لەسەر لا تەنیشت** lateral (side) **ڕێژەی کاری سیستەمی گلایمفاتیك** Glymphatic transport **بۆ ئالوگۆری شلەی مێشك ودڕکە پەتك و شلەی نێوانی خانەکان زۆر کارا و باشتر و خێراتر و نموونەیی بووە, وە زۆرترین بڕی لە پاشەڕۆیەکانی پاککردۆتەوە بە بەراورد بە شێوازەکانی تری خەواندن وەك لەسەر سك و پشتدا**(Supine (back) and Prone (stomach) **(وێنە:5). مانەوەی پاشەڕۆیەکان و تۆکسینەکانی زیندەکردارەکان کە بەشی هەرەزۆری لە کاتی بەئاگابوون پەیدادەبن کاریگەری زۆر خراپیان هەیە لەسەر زیندەفرمانەکانی مێشك وەك ڕاگرتنی زیندەگەینەك و پەیوەندی وسیگنالی دەماری لە گەینکەدەمارەکان و هەوکردن و لەناوچوونی دەمارەخانەکان و تووشبوون بە چەندین نەخۆشی دەماری وەك دەبەنگی** Dementia **زاهایمەر** Alzheimer's disease ...**هتد** (24-30).

**ڕێنمایی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی نووستن لەسەرلاتەنیشت ئیعجازێکی زانستی و چەندین ڕاستی زانستی** Scientific facts **زۆر ڕوون و ئاشکرا و وورد و سەرسورهێنەری تێدایە, بەوەی چەندین کاریگەری باش و ئەرێنی هەیە لەسەر تەندروستی و زیندەفرمانەکانی تێکڕی لەش,ئەمانە هەمووی بەڵگەی حاشاهەڵنەگر و جێگای نەبوونی دوودڵی وگومانن لەسەر ڕاستی ودروستی و هەقی کۆتا پەیام و شەریعەتەکەی موحەممەد سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت, پاك و بێگەردیش بۆ خودای پەروەردگاری زانا و نهێنی و پەنهانزانی بوون و مرۆڤ, دەستوور و بەرنامەکەی هەر هەمووی لە بەرژەوەندی ژیان و بەختەوەری مرۆڤە لە دونیا و دوارۆژدا.**




**وێنە(4): فراوانبوونی نێوانە بۆشایی مێشك لە خەودا بە ڕێژەی 60٪ و باشکردن و خێراکردنی گوزەری شلەی دڕکەمێشك CSF و پاکردنەوەی مێشك لە پاشەڕۆیەکانی زیندەکردارەکان.**




**وێنە( 5 ): کرداری زیندەرێچکەی گلیمفاتیك پاککردنەوەی مێشك لە پاشەرۆیەکان بەهۆی باشکردن و خێراکردنی ئالوگۆری شلەی درکەمێشك CSF و شلەی نێوانە خانەکانISF (Glymphatic pathway) .**

### 3.2.کاریگەرییە باشەکانی نووستن لەسەر لاتەنیشتی ڕاست لەسەر تەندروستی و زیندەفرمانەکانی تری لەش Beneficial effects of sleeping on Right lateral on Health and physiology

**نووستن لەسەر لاتەنیشتی ڕاست** Right-Side Sleeping Position **کاریگەری و رۆڵی زۆر ئەرێنی و باشی هەیە, لەوانە زوو و خێرا خەولێکەوتن و ئارامکردنەوەی بیرو هۆشی مرۆڤ و کەمکردنەوەی دڵەڕاوکێ**Anxiety **و گرژیی دەماریی و بیر ئاڵۆزی لەرێگەی چەندین میانیزم لەوانە کارکردنی دڵ بەکەمترین زیندەکار و پاڵپێوان وگەیاندنی بڕی خوێنی پێویست بۆ هەموو بەشەکانی لەش زۆر بە ئاسانی و بەخشینی ئارامی و ونۆقرەیی بەتەواوی لەش(** 33‑31 **)**.

**توێژینەوە تاقیکاریەکان**Experimental research **دەریا نخستووە نووستن لەسەر لاتەنیشتی ڕاست کاریگەری زۆر باشی هەیە لە کەمکردنەوەی توندی و مەترسیەکانی وەستانی هەناسەدان لە کاتی نووستندا**Sleep apnea **وباشکردنی زیندەفرمانەکانی هەناسەدان لە ڕێڕەو و بۆریچکەکانی هەوا وسی یەکان** Trachea and lungs **و زیادکردنی قەبارەی ئاڵوگۆڕی گازەکان** Gas exchange **و زیادکردنی زیندەقەبارەی هەوای سی یەکان**Pulmonary vital capacity (34-39).

**هەروەها نووستن لەسەر لاتەنیشتی ڕاست ڕێگەیەکی خۆپارێزی زۆر کارا وباشە لە کەمکردنەوەی مەترسیەکانی نەخۆشی درێژخایەنی نازیندەفرمانی سکۆڵەی چەپی دڵ** Chronic Left Ventricular Dysfunction **و ناتەواویەکانی دڵ** Congestive heart failure **و باشترکردنی زیندەفرمانی ماسولکەکانی سکۆڵەی چەپی دڵ. بە پێچەوانەوە نووستن لەسەر لاتەنیشتی چەپ دەبێتە هۆی زیاتر کشانی ماسۆلکەکانی سکۆکۆڵە چەپ** Left ventricular dilation **و بەرزبوونەوەی پڕبوونە پەستانی خوێن** Left Ventricular filling pressure **وکەمبوونەوەی بڕی خوێنی دەرپەریووی سکۆڵەی چەپی**

دڵ Cardiac output و زیادبوونی چالاکی هاوسۆزه دەمارەکان لەسەر دڵەلوولە کۆئەندام Sympathetic nervous activity, بە نووستن لەسەر لاتەنیشتی ڕاست ئەم کاریگەرییە خراپانە لەسەر دڵ ولوولە کۆئەندامدا نابێت و یارمەتی کەمکردنەوەی بارە نافرمانیەکانی سکۆڵەی چەپی دڵ و نەخۆشیەکانی کەموکورتی وناتەواوییەکان دڵ دەدات و دڵەلوولە کۆئەندام زۆر بە ڕێك و پێکی و ئارامی بەبێ هیچ کێشە و گرفتێکی زیندەگی کاردەکات (37–47).

## 4- ئیعجازی زانستی زوو نووستنی شەوانە و ماوەی پێویستی نووستن

## Scientific Miracle of Early sleeping at night and Hours Sleeping

لە ئاکار و ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم زوو نووستنی شەوانە Early sleeping at night وماوەی نوستنی پێویستە, لە چەندین فەرموودە مسوڵمانانی هانداوە شەوانە زوو بخەون و نەهی لێکردوون لە مانەوە وشەونخونی و قسە وباسی دوای عیشا مەگەربۆ ئیش وکاری زۆر پێویست نەبێت وەك خوێندنی زانست و زانیاری و نوێژکردن و راکردنی کاروباری مسوڵمانان وەك لە فەرموودەی: عَنْ أَبِي بَرْزَةَ قَالَ : " كَانَ النَّبِي صلى الله عليه وسلم يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَ الْعِشَاءِ وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا " رواه البخاري ومسلم. واتە: ئەبی بەرزە خودا لێ رازیبێت دەلێت: پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم نووستنی پێش نوێژی عیشا و قسە وباسکردن و شەنخۆنی دوای نوێژی عیشای پێناخۆش وناپەسەندبوو, وە ئیبن مسعود خودا لێ رازیبێت دەلێت: پێغەمبەری خودا نەهی لێکردوین لە قسەوباسکردن وشەونخونی دوای عیشا. وە دەربارەی ماوەی نووستنی پێویستی ڕۆژانە لە ئاکار و بەرنامەی نوستنی شەوانە و سەرخەوی نیوەڕۆی پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم دەردەکەوێت کەوا ماوی پێویست ڕۆژانە نووستووە, وەك لە فەرموودەی: عن عبد الله بن عمرو بن العاص رضي الله عنهما أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال له :أحب الصلاة إلى الله صلاة داود عليه السلام وأحب الصيام إلى الله صيام داود عليه السلام، وكان ينام نصف الليل ويقوم ثلثه وينام سدسه ويصوم يومًا ويفطر يومًا , رواه البخاري ومسلم) واتە: عبدالله کوڕی عەمری کوڕی عاص خودا لێان رازیبێت دەلێت: پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم پێ فەرمووم: خۆشەویسترین شەونوێژ و ڕۆژ لای خودایەو شەونوێژ و ڕۆژووگرتنی داوود پێغەمبەرە سەلامی خوای لەسەربێت, نیوەی شەو دەنووست و سێ یەکی شەویش شەونوێژی دەکرد و دواتر شەش یەکی تر دەنووستەوە, وە ڕۆژێك نا ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو.

وە دەربارەی شەونوێژ و نووستنی پێغەمبەری خودا صلی الله علیەوسلم پرسیار لە عائیشەی دایکی ئیمانداران کرا فەرمووی: پێغەمبەری خودا سەرتای شەو تا نیوەی دەخەوت و کۆتایی شەوی بە شەونوێژ زیندوودەکردەوە و دوایی دەگەڕایەوە سەرجێگا و دەخەوت تا بانگی بەیانی ئنجا هەڵدەستا دەستنوێژی دەگرت و دەردەچوو بۆ نوێژ( رواه البخاري ومسلم ).

بە ووردبوونەوە و تێڕامان لەم فەرموودانە و خەمڵاندنی ماوەی تێکڕای درێژی شەوەکانی شاری مەدینە لە ساڵدا, بۆمان دەردەکەوێت مامناوەندی ماوە شەوەکانی مەدینە لە دوای عیشا تا بەیانی 8 تا 9 کاتژمێرە, بەمەش ماوەی نووستنی شەوانەی پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم لە دەوروبەری 6 تا 7 کاتژمێربووە, لەم فەرموودە و ئاکار و ڕێنمایانەی پێغەمبەری خودا ئیعجازێکی زانستی و یەکانگیرێکی زانستی تێدایە لەگەڵ زۆربەی داتاو دەرەنجامی توێژینەوەکانی دەربارەی ماوەی پێویستی نووستنی شەوانە بۆ مرۆڤی پێگەیشتوو لە تەمەنی پێگەیشتوو و سەرڕاستیدا, هەموویان ماوەی نووستنی پێویستی ڕۆژانەیان لە نێوان 6 تا 7 کاتژمێر دیاریکردووە, پاك وبێگەردی بۆ خودا ,ئاکار و ڕێنماییەکانی پێغەمبەرەکەی بۆ نووستن بە بەرنامەی نموونەیی نووستنOptimal program for sleeping دادەنرێت بە پێ هەموو ڕێنمایی و راسپاردەکانی ناوەندە ئەکادیمی و توێژینەوەکانی تایبەت بە نووستنی مرۆڤ!! ( خشتە:7 ) (48), سبحان الله ! بەرنامەی نووستنی ڕۆژانەی پێغەمبەری خودا تەواو

یەکانگیر و هاویەکە لەگەڵ زیندەفرمانەکانی ئەو کاتژمێرە زیندەگیەی خوای پەروەردگاری لە لەشی مرۆڤ سروشتاندووە Biological o'clock or Circadian rhythm کە بەشێك لە کارەکانی ڕێکخستنی سوڕی نووستن و بەگائاییە یە لە مرۆڤدا.

| ماوەی نووستنی پێویست<br>Sleep Needs ( Hours) | تەمەن و باری مرۆڤ<br>Age and condition of human |
|---|---|
| 14 تا 17 کاتژمێر | منداڵی تازە لەدایکبوو تا 3 مانگ<br>Newborns (0–3 months) |
| 12 تا 15 کاتژمێر | منداڵی شیرەخۆرە لە 4 مانگ تا 11 مانگ<br>Infants (4–11 months) |
| 11 تا 14 کاتژمێر | منداڵی بەسەرپێکەوتوو لە 1 ساڵ تا 2 ساڵان<br>Toddlers (1–2 years) |
| 10 تا 13 کاتژمێر | منداڵی پێش چوونە قوتابخانە 3 تا 5 ساڵان<br>Preschoolers (3–5 years) |
| 9 تا 11 کاتژمێر | منداڵی قۆناغی قوتابخانە لە 6 تا 13 ساڵان<br>School-age children (6–13 years) |
| 8 تا 10 کاتژمێر | هەرزەکاران لە 14 تا 17 ساڵان<br>Teenagers (14–17 years) |
| 8 تا 9 کاتژمێر | Adults (18–25 years)<br>پێگەیشتوو لە 18 تا 50 ساڵی |
| 7 تا 8 کاتژمێر | 26 تا 63 ساڵی<br>Adults 26 - 63 years) |
| 6 تا 7 کاتژمێر | تەمەندار سەروو 64 ساڵی بەرەو سەروو<br>Older Adults (50 years and over) |

خشتە(1): ماوەی نووستنی پێویستی ڕۆژانەی مرۆڤ بە پێ قۆناغ و تەمەنەکانی مرۆڤ(48)

دەرەنجام وداتای توێژینەوە تاقیکاری و ڕووپێویەکان Experimental and Survey Research دەریا نخستووە زوو نووستنی شەوانە Early sleeping at night و ماوەی پێویستی نووستنی شەوانە سوود و ڕۆڵ وکاریگەری زۆر باشی هەیە لەسەر زیندەفرمان وتەندروستی لەش, لە کەمکردنەوەی دڵەڕاوکی Anxiety و گرژی دەماری Tension and irritability و سترێسی دەروونی Psychological stress و باشکردنی میزاج و مۆڕالی کەسی Mood and Moral و دووربوون لە خەوزڕان Sleep deprivation و تێکچوون و شلەژانەکانی نووستنی شەوانە, باشکردنی زیندەفرمانی هزری و ژیری مێشك Cognitive performance و یادگا وزیادبوونی بەئاگایی Alertness و زیادبوونی چالاکی لەش و کارامایی کار و بەرهەمهێنان Productivity وداهێنان Creativity لە ڕۆژدا, هەروەها دەرکەوتوو زوو نووستنی شەوانە کاریگەری زۆر باشی هەیە لە ڕاگرتنی

کێش لەش و کەمکردنەوەی ئەگەری تووشبوون بە قەڵەوی Obesity ومەترسیەکانی نەخۆشی شەکرەDiabetes type 2 وبەرزەپەستانی خوێن و نەخۆشیەکانی دڵ و مێشك و دەماریی و کێشە وگرفتی هەرس و ریخۆڵەکان و گورچیلەکان وباشکردنی سیستەمی بەرگری لەش و دووربوون لە شەکەتبوون و ئێش وئازاری ماسولکەکان و تازەکردنەوە و ڕەوەنقکردنی خانەکانی پێست و دواخستنی ماکەکانی پیربوون Aging و نەخۆشیەکانی پەیوەست بە پیری Aging- related Diseases (49-50).

لە 80٪ نووستنی قووڵی شەوانەی مرۆڤ Non-REM sleep (چەشنی یەکەمی نووستن) دەکەوێتە سەرەتای شەو تا سێ یەکی شەو کە باشترین و پڕسوودترین کاتەکانی خەوی مرۆڤە لە ڕووی زیندەفرمانی و تەندروستی لەش و سایکۆلۆجی. درەنگ نووستنی شەوانە و کەمخەوی شەوانە. مرۆڤ بێ بەش دەکات لە چەشنی یەکەمی نووستن و زۆربەی خەوەکەی قۆناغ و چەشنی دووەمی نووستنە (REM sleep) وە دووچاری چەندین گرفت و کیشەی تەندروستی و دەروونی دەکات و کاریگەری خراپی دەبێت لە ڕایکردنی ئیش وکارەکانی رۆژانە و توانستی هزری و ژیریی و درکردنی مێشك وعەقلی مرۆڤ.

## کاریگەرییەخراپەکانی کەمخەوی و درەنگ خەوتنی شەوانە لەسەر تەندروستی و زیندەفرمانەکانی لەش مرۆڤ

## The effects of sleep deprivation and Delayed sleeping at night on health and physiology

1ـ کەمخەوی و گرفت و تێکچوون و شلەژانەکانی نووستن Sleep disorders و بێ بەشبوون لە تێرخەوی Sleep Deprivation درێژخایەن مرۆڤ دووچاری خەوزڕان Insomnia چەندین مەترسی تەندروستی دەکاتەوە لەسەر دڵەلوولە کۆئەندام وەك نەخۆشیەکانی دڵ Heart disease و نۆرەی دڵ Heart attack و کەمکورتی پەتکەوتەیی دڵ Heart failure و ناریکی ولاسەنگی ترپە ولێدانەکانی دڵ Irregular heartbeat و بەرزەپەستانی خوێن High blood pressure وشەکرە Diabetes و نۆرەی مێشك Stroke,توێژینەوەکان دەریانخستووە بێخەوی و کەمخەوی (کەمتر لە 6 کاتژمێری شەوانە) مرۆڤ تووشی ئەم نەخۆشی و دەردانە دەکات لە رێگەی چەندین میکانیزم لەوانە زیادبوونی کێشی لەشWeight gain و قەڵەوبوون Obesity لەرێگەی تێکچوون ولاسەنگ بوونی دەردانی زیندەگەردەکان و هۆرمۆنەکانی (وەك Insulin ,Cortisol ,leptin, Ghrelin, Melatonin,) زیادبوونی ئارەزووی خواردن Appetite و گۆڕانی میتابۆلزمی Metabolism لەش و زیندەکردارەکانی گلوکۆز Glucose metabolism و هەروەها لە رێگەی زیادبوونی هەوکردنەکان inflammation و سترێسە دەروونیەکان Psychological stresses (51-63, 70).

2ـ کەمخەوی و خەوزڕان Insomnia و بێخەوی شەوانە Night Sleepiness دەبێتە هۆی لاوازبوونی بەرگری لەش و توانای سیستەمی بەرگری لەش Immune System بۆ دروستکرنی زیندەگەردە بەرگرییەکان وەك سایتوکاینەکانCytokines و دژەتەنەکان Antibodies و خانە بەرگرییەکان Immune cells زۆر کەم دەبێت و هەوکردن Inflammations زیاددەکات و توانای سیستەمی بەرگری لەش بۆ لەناوبردنی تەنە نامۆ و میکرۆبەکان وەك بەکتریا و ڤایرۆس و مشەخۆرەکان زۆر کەم دەبێت(59, 63-70).

3ـ کەمخەوی و خەوزڕان Insomnia و بێخەوی شەوانە Night Sleepiness (کەمتر لە 6 کاتژمێری شەوانە) دەبێتە هۆی تووشیوون بە خەمۆکی Depression و دڵەڕاوکی Anxiety و تێکچوونی میزاجی کەسی وباری دەروونی و زوو هەڵچوو Irritable

**بە پێ چەندین توێژینەوەی ڕووپێوی هەمووی ئەوانەی تووشی خەمۆکی و دڵەڕاوکی بوونە شەوانە** , and Mood disorders **کەمتر لە شەش کاتژمێر دەخەون, وە ئەوانەی شەوانە کەم دەخەون و تووشی خەوزڕان دەبن پێنج جار لە پێشترن بۆ ئەگەری تووشبوون بە نیشانەکانی دڵەڕاوکی و خەمۆکی و کەمبوونەوەی ئاگایی و لاوازبوونی توانای فێربوون و وەبیرهاتنەوە و تیکچوونی باری دەروونی و میزاجی کەسی و زوو هەڵچوون و تورەبوون و دڵتەنگی و خەمباربوون. ئەم تێکچوونانە هەموو دەگەڕێتەوە بۆ تێکچوون و نارێك بوونی زیندەفرمانەکانی مێشك و لاسەنگبوونی هۆرمۆنەکانی دەماریی**Neurotransmitters Hormone **و کەمبوونەوەی پەیوەندی گەینکەکانی دەمارەخانەکانی** Synaptic Connection of Neurons **مێشك و کۆبونەوە وکەڵەکەبوونی پاشەڕۆییە لاوەکیەکان** Metabolism byproducts**و ژەهرەکانی** Toxins **زیندەکردارەکان لە خانەکانی مێشك . کە مخەوی وبێخەوی شەوانە(کەمتر لە 6 کاتژمێری شەوانە) دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی زیندەفرمانەکانی مێشك لە ڕێگەی کەمبوونەوەی تێکڕای میتابۆلزمی دەماغ** Brain metabolic rate , **بەمەش کردارەکانی درککردن وتوانای یادگا و فێربوون و ئاگایی و کرداره لۆژیك و چارەسەرییەکانی مێشك زۆر کەم دەبێت و زوو دەرکەوتنی چەندین تێکچوون وگرفتی مێشك و دەماری** Neurodegenerative disorders**وەك زەهایەمەر** Alzheimer's disease (AD) **و بیرکۆلی** ( 84‑70 ).

4ـ **کە مخەوی وبێخەوی شەوانە( کەمتر لە 6 کاتژمێری شەوانە ) دەبێتە هۆی پیربوونی پێست و زوو دەرکەوتنی نیشانەکانی پیربوونی پێست** Skin aging **وەك لە دەستدانی نەرم و ڕەونقی و ڕۆشنی پێست و دەرکەوتنی هێڵی وورد وبازنەی ڕەشی دەوری چاو ودەرکەوتنی چرچ ولۆچی پێست.کە مخەوی و بێخەوی دەبێتە هۆی زۆر دەردانی سترێسە هۆرمۆنی کۆرتیزۆل و زۆربوونی سترێسی ئۆکساندن** Oxidative Stress **و ڕەگەسەربەستەکان** Free radicals **کە کاریگەری زۆر خراپیان هەیە لە تێکشکاندنی پرۆتینی کۆلاجینی پێست کە ڕاگری لووسی و جیری و توندی پێستە,هەروەها کە مخەوی و بێخەوی دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی دەردانی هۆرمۆنی گەشە کە ڕۆڵ وکاریگەری زۆر باشی لە سارێژکردنەوە** Heal **و چاککردنەوەی**Repair **خانەکانی پێست لە ڕێگەی هاندانی خانەکانی پێست بۆ دابەشبوون و قەربووکردنەوەی خانەلەکارکەوتوو وفەوتاو و پیربووەکان و تێکچووەکانی ڕۆژانەی پێست**( 85‑93 ).

5ـ **کە مخەوی وبێخەوی شەوانە (کەمتر لە 6 کاتژمێری شەوانە ) دەبێتە هۆی تێکچوون ولاسەنگبوونی سوڕی دەردانی هۆرمۆنەکان** Hormones **و زیندەگەردەکانی میتابۆلزمی لەش** Metabolism **و ڕێکخەری کاتژمێری زیندەگی لەش** Circadian rhythm **دەبنە هۆی تێکچوون و لاسەنگی و نارێکی وکەمبوونەوە لە تێکڕای زیندەفرمانەکانی هاوسەنگی ناوەگی** Homeostasis **و مێشك و دەمار و دڵەلوولە کۆئەندام و سی یەکان و گورچیلەکان وتوانای سێکسی و پیتاندن و کردارەکانی هەرس و کاری ماسولکەکان..هتد** ( 101‑94 ).

## هاویەکی زوو نووستنی شەوانە وریکخەری کاتژمێری زیندەگی نووستن

## Early sleeping at night and Circadian Rhythm of Sleep

نوستن لەمرۆڤدا ریگەی دوو میکانیزم ریك دەخریت و کۆنترۆلدەکریت:هاوسەنگی ناوەکی سوڕی نووستن و بەئاگایی Sleep/Wake Homeostasis و ریکخەری کاتژمێری زیندەگی Circadian Biological Clock ; هەرکاتیك مرۆڤ بۆ ماوەیکی زۆر بە ئاگابوو هاوسەنگی ناوەکی نووستن وبەئاگایی Sleep/Wake Homeostasis لە ریگەی چەندین زیندەگەرد ناوچەکانی نووستن لە مێشك هاندەدات بۆ دەردانی چەند زیندەگەردیکی وەك گابا GABA و گالانین Galanin ناوەندە بەئاگاکانی مێشك Arousal centers دەوستێنیت و کپدەکات,ناوچەی بەشی ناوەکە بینراوی Ventrolateral preoptic nucleus (VLPO) زۆر بەهیزە دەتوانیت ناوچەکانی هاندەری بەئاگابوون Wake بکوژینتەوە و بوەستێنیت Inhibition (وێنە:1,2).کاتیك دەمارەخانەکانی لاتەنیشتی ژێرلانکە مێشك زیندەگەردی هایپۆکریتین Hypocretin یان ئۆرکسین Orexinو هیستامین Histamine ووندەکەن دۆخی بێئاگابوون و بێهۆشی لە بەشی هەرەگەورەی دەماغ کە تویکلی مێشك پەیدادەبێت و هانی دەستپیکردنی نووستن دەدات (4,5 ,14􀀀11).

هەروەها نووستن لە ریگەی ریکخەری کاتژمێری زیندەگی Circadian Biological Clock ریکدەخریت, لە تاریکی شەودا کاتیك رووناکی نامێنی و کز دەبیت هەستەوەرە خانەکانی تۆرەی چاو Retinal ganglion cells وریادەبنەوە و دەمارە راگەیاندن وسیگنالێ دەنێرن بۆ ناوچەی SCN ی ژێرلانکەی مێشك بۆ دوبارە بەکارخستنەوەی ریکخەری کاتژمێری زیندەگی لەم ناوچەیەی دەماغ, ئەویش دەبێتە هۆی دەردانی هۆرمۆنی میلاتۆنین Melatonin و بەرزبوونەوەی ئاستەکانی میلاتۆنین لە پلازمای خوێن لە سەرتای شەو دەست پیدەکات تا سێ یەکی شەو دەگاتە لوتکە دواتر دەستدەکات بە دابەزین تا بەرەبەیان و رۆژهەلاتن نامێنی, میلاتۆنین باری خەوهاتن پەیدادەکات Drowsiness و کاردەکاتە سەر دەردانی گوێزەرە دەمار و زیندەگەردەکانی کاتژمێری زیندەگی تایبەت بە وەستاندن وکپکردنی Inhibition ناوچەکانی هاندەری بەئاگابوونی کاتژمێری زیندەگی لە ژێرلانکی مێشك و تویکلی مێشك Arousal centers و ناوچەکانی هاندەری بەئاگابوون Wake دەوستێنیت Inhibition دۆخی بێئاگابوون و بێهۆشی لە بەشی هەرەگەورەی دەماغ کە تویکلی مێشك پەیدادەبێت و هانی دەستپیکردنی نووستن دەدات.

زوو نووستنی شەوانە و تاریکی شەو دەبێتە هۆی دەردانی هۆرمۆنی میلاتۆنین کە رۆڵ و کاریگەری زۆر باشی هەیە لەوانە ریکخستنی کاتی خەوتن و سووری نووستن/ هەستان Sleep/wake cycle و چاڵاککردنی توخمەرژێنەکان و ریکخستنی پەستانی خوێن و دژەئۆکسانیکی زۆر کارا و بەهیزە Antioxidants , نەهێشتنی گەشەی شێرپەنجەخانەکان tumor cell growth و لابەری کانزا قورسەکان Metal chelation و بەهیزکردنی بەرگری لەش وەڵامدانەوەی دژی هەوکردنەکان Immune response و هێورکەروە و ئازارشکینیکی باشی شەوانە و باشکردنی بار و بەختەوەری دەروونی و میزاجی کەسی Happiness and mood هەروەها پاراستنی مرۆڤ لە نەخۆشیەکانی پەیوەست بە گرفت وتیکچوونی ریکخەری کاتژمێری زیندەگی لەش وەك قەلەوی و شەکرە و خەمۆکی و زوو پیربوون Premature ageing و نەخۆشیەکانی دڵ Cardiovascular diseases و زەهایەمەر و بیرکۆڵی و تیکچوون وشلەژانەکانی دەروونی و میزاج و خەوزڕان Sleep deprivation (4,5 ,11-14).

